زنجیرە کتێبی گۆڤاری کۆچ

ژمارە ( ٢٤ )

# مشتێک لە خەرمانی بیری نالی

نووسینی

ئیسماعیل فەرەج ئەحمەد

٢٠١٥

سەرپەرشتیاری زنجیرە کتێبی گۆڤاری کۆچ

سەرنووسەر حەبیب محەممەد دەروێش

ناوی کتێب: مشتێک لە خەرمانی بیری نالی

بابەت: لێکۆڵینەوەی ئەدەبی

نووسەر: ئیسماعیل فەرەج ئەحمەد

دیزاینی ناوەرۆک: حیکمەت مەعروف \ ئالین دیزاین

دیزاینی بەرگ: هەرێم عوسمان

نۆبەتی چاپ: یەکەم

تیراژ: ٥٠٠ دانە

چاپخانە: بینایي

ژ. سپاردن: لە بەڕێوەبەرێتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارە سپاردنی (١٧٤٣) ی (٢٠١٥) ی پێدراوە.

## نێوەرۆک

- پێشەکی ٥
- کەسایەتیی نالی ١١
- رۆشنبیریی نالی ٣٧
- داهێنان لای نالی ٦٩
- زمان لای نالی ١٠٣
- نالی لە دیدێکی سۆسیۆلۆژییەوە ١٣١
- سەرنجامی توێژینەوەکە ١٨٥
- سەرچاوەکان ١٩٨



مشتێک لە خەرمانی بیری نالی
ئیسماعیل فەرەج ئەحمەد

## پێشەکی

سالآنێک خولیای ژیانو بەرهەمەکانی نالیی لووتکە بووم. لە باپیرمەوە زۆرم لە سەر بە توانایی ئەم مەزنە دەبیست. ئاگاداری زۆر بۆنەو دانیشتن بووم، کە تەرخان ئەکران بۆ باسکردنی بەرهەمەکانی ئەم مەزنە. ئەمە جگە لەو بلاوکراوانەی لە سەردەمێکدا بووبوونە وێردی سەر زمانی توێژی خوێنەواران. هەر لەو سەردەمەوە بە پشتیوانی هەوڵەکانی مامۆستا بەرزو بەڕێزەکان، وەک: مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس و مەسعود موحەمەد، کە کۆمەڵگای کوردییان زیاتر بە نالی ئاشنا کرد. بواریان بۆ چەندین باس و لێکۆڵینەوەی تر خۆشکردو ئەوەندەی تر دیدو بۆچوونەکانی هەوادارانی نالییان دەوڵەمەند کرد.

لەو سەردەمەوە هەر جارەو داهێنانو بابەتێکی نوێ لە شاکارەکانی ئەم مەزنەدا بەدیئەکرێن. وایکردووە هونەرمەندە دەنگخۆشە بەتواناکانی نەتەوەکەمان شاکارەکانی ئەم مەزنە بکەنە سۆزی دەروون و چریکەی نەبڕاوە و خزمەتی هونەری کۆمەڵگای کوردی پێبکەن.

دیوانی نالی لە گرنگترینو بەسوودترین کتێبێک بوو لە ساڵی ١٩٧٦ دا بە لێکدانەوەو لێکۆڵینەوەی شایستەوە کەوتە دەستی خوێندەواران. پاشان دەستەو دامەنی نالی،





چەپکێک لە گوڵزاری نالی، کە بە رادەیەکی زۆر بەرفرەوانتر مەلا خدر ئەحمەد شاوەیسی میکایەڵی ناسراو بە نالی بە کۆمەڵگای کوردی ناساند. بە پێی ئەو دیوانە نالی لە نێوان ساڵی ١٧٩٧ و ١٨٠٠ لە گوندی خاکوخۆڵی شارەزور لە دایک ئەبێت، تاکو ئێستا چەمی شاوەیس لە گوندەکەدا ناوی باپیری نالی ون نەکردووە.

لە شیعرەکانی نێو دیوانی نالی‌دا زۆر بواری مێژوویی، ئەستێرەناسی و ماتماتیک و ئایین و ستراتیژیەتی نووسین و بواری سەربازی و بەڕێوەبردن و پێناسە و قەڵەمڕەوی و دەوڵەت و وشەئارایی و زمانەوانی.. هتد بەدیئەکرێن.

نالی وەک دامەزرێنەری رێوگەی کلاسیکی شیعری کوردی، تاکو ئێستا کاریگەری بە سەر نووسین و بیرو بۆچوونی شاعیران و نووسەران و روونبیرانی گەلەکەمانەوە دیارەو لە بواری هونەری دەرخستنی رۆشنبیری‌و شارستانیشدا رەنگدانەوەیەکی ئاشکرای هەیە.

سەرەتا لە دیدێکی رۆشنبیری‌و شارستانی‌و کولتوورییەوە گرنگیم بە تێڕوانین لە ژیانی کۆمەڵایەتی‌و کەسایەتی‌و داهێنانو زمان پاراوییەوە بۆ نالی زیاتر بوو، وەک لەوەی گرنگی بە مێژووی لە دایکبوونو مردنو

دانانی شاکارەکانبێت. ئەو بابەتانەم بە ئەرکی کەسانی پسپۆڕی مێژوو، ئارکیۆلۆجیی مرۆڤایەتیو شوێنەوارناسەکان ئەزانی. ئەوەندەی بە لای منەوە گرنگ بوو ئەو تێڕوانینە سۆسیۆلۆجییە دیارە بوو، کە نالی درکی پێکردووەو بەو شێوازە کردوونی بە بنەمای چەسپاندنی زمانی کوردی لە نووسینو ئاخاوتندا.

شیعرەکانی نالی ئەکرێت لە چەندین روانگەوە پۆلێن بکرێن: لە رووی پەیوەندییە کۆمەڵایەتیغەکانی کۆمەڵگاوە. لە رووی دەسەڵاتو داڕشتنی پێگەی نەتەوەییو کۆمەڵایەتیەوە. لە رووی پێشکەوتنی رۆشنبیریو شارستانیو کولتوورەوە. لە رووی بەرزیی ئاستی بیرو دەسەڵاتی لە رادەبەدەری ئەو زانیاریو زانستانەی بەدەستیهێنابوون.

دیارە لە یاساو رێساکانی سۆسیۆلۆژیدا چەندین سەردەمو رەوش هەیەو دەتوانرێت لێوەی بگەینە چەندین دەرەنجامو مەبەستی دیاریکراو. لەوانە دایەلۆگو هەڵسەنگاندنو بەراوردو رێکخستن، تا بەدواچوونو گەشەو پێشکەوتن ئاشکرابنو گۆڕانکاریو چارەسەر بەردەوام بێت. ئەم لایەنانە بوونیان لە بنەمای بەرهەمەکانی نالیدا هەیە. بۆیە توانیویەتی سنووری





سەردەمی خۆی بشکێنێتو لەگەڵ هەر بەرەو پێشچوونێکدا خۆی نوێ بکاتەوە.

پێئەچێت نالی لەو سۆنگەیەوە وتەیەکی کردبێتە بنەمای بیرکردنەوەی، کە نەجووڵانو نۆژەننەبوونەوەو چەقبەستن واتای مردنە. هەر کەسو نەتەوەو کۆمەڵگایەک ئەو خەسڵەتانەیان تێدابێت، ئەوە بەرەو کەنار رێئەکەنو لە خانەی دەروونیو جەستەیی بەرتەسک دەربازیان نابێت. گۆرانی بۆ پاڵەوانی نادیاری پێشینەیان ئەڵێنەوە. ئەو پێشینەیە لە هیچ کەلەبەرێکی سروشتیو کۆمەڵایەتیاندا خۆی مەڵاس نەداوەو بوونی نییە.

لەم لێکۆڵینەوەیەدا بە شێوازێکی سۆسیۆلۆژیانە بە کورتی باس لە توانایی تێڕوانینی نالی ئەکەم لە رووی کەسایەتییو داهێنانو زمانەوانیو رۆشنبیریو کۆمەڵایەتییەوە. چڕو پڕیی بەرهەمەکانی نالی چەندین لێکۆڵینەوەو باسیتر لە خۆیان دەگرن. دیارە لەم تێڕوانینەوە خۆم لە شیکاری وشەکان نەداوە تاکو خوێنەر خۆی لە رووی زمانەوانییەوە ئەو وشە ئاراییانە هەڵسەنگێنێت. ئەوەی من مەبەستمە تەنها شرۆڤەی کرۆکی چۆنیەتیی ئەو تێروانینانەیە، کە نالی لە ژیانو دەرووبەری سروشتیو مرۆڤایەتی روانیووە. واتە ئەم

لێکۆڵینەوەیە تێڕوانینێکە، کە دەکرێت بەدواچوون‌و لێکۆڵینەوەی فرەوانتری لە بارەوە بکرێت.

من وەک عاشقێکی ئەو مەزنە لە هەوڵ‌و دەستە کوتێدام تا چمکێکی چامی کەواکەی، یان ریشوەیەکی سەرو مێزەرەکەی بەردەستم بکەوێت. هیچ نەبێت رێگا خۆشبکەم خەڵکانی بە توانا بەو مێژووەدا بچنەوەو چەند راستییەکی‌تری لێهەڵبهێنجن‌و بنەمای زانستی نەتەوەییمان درەوشاوەتر بکەن. خۆی گوتەنی:

**یا توربەتێ، یا غوربەتێ یا رێ بشکێنین**
**هەر مونتەظیرە (نالی) ئەگەر مرد و ئەگەر ما.**
(١٢١:١٤)

تاوەکو بتوانرێت رۆشنبیری‌و شارستانیی نەتەوەییمان بێ دژایەتی بێ بنەما بەرەوپێش بچێت. راستەوخۆ لەگەڵ برەوی رۆشنبیریی سەردەمدا وەک پێویست لێکیان بئاڵێنین‌و لە بێژنگیان بدەین. کەسانی شارەزای دڵسۆزی نەتەوەکەمان بتوانن بەرفرەوانتر لە چەندین روانگەی بیرکردنەوەی نالی بکۆڵنەوە.

**ئیسماعیل فەرەج**

***

**کەسایەتیی نالی**

لێکۆڵینەوە لە نالی وەک خۆدانە بەر شەپۆلی ئۆقیانوسێکی بێکۆتایی وایە. دیارە ئەگەر ئاوابێت کارەکە بەو ئاسانیە نییە، کە بتوانین شێوازی کەسایەتی‌و داهێنان‌و چالاکییە بیرییەکانی ئەو مەزنەو شێوەی بیرکردنەوەی شرۆڤە بکرێن‌و گرێوگۆڵی نهێنیەکان بکرێنەوە، خۆی واتەنی:

**(نالی) عەجەب بە قووەتی حیکمەت ئەدا دەکا**
**مەعنایی زۆر و گەورە بە لەفظی کەم و بچووک**
(١٤–٢٦٠)

یاخود بە پێی بۆچوونی مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەڕڕیس لە پارچە شیعرێکدا نالی مەزن لە خۆی دەدوێت‌و دەڵێت:

**ناودان قلم نالی فصاحتده همان**
**نشئەی آب بقا، زمزمەء کوثری وار**
(١٤.٢١٨)





ئەمە واتە بسولکی قەڵەمی نالی لە ڕەوانیدا نەشەی ئاوی حەیات‌و بیری هەڵقوڵینی حەوزی کەوسەری هەیە. هەڵقوڵین‌و لەبەر ڕۆیشتن‌و بەردەوامیی واتای زیندوو مانەوەیە واتای ژیانە. ئەو حەوزەی نالی مەبەستێتی ئەو ئۆقیانووسە بێ سنوورەیە، کە پێویستی بە (غواص) هەیە تا مرۆڤ بتوانێت تیایدا ڕۆبچێت. خۆی گوتەنی:

**بەحری غەزەلم پڕ لە دوڕو گەوهەرە، ئەمما**
**غەوواصی دەوێ یـــەعنی بە تـــەعمیقی بزانە**
(١٤.٤٨٠)

وەنەبێت نالی ئاگاداری جوگرافیا نەبووبێت، نەخشەیەکی بەئاگایانەی جیهانی لەبەردەستدا بووە، کە شارەزایانە بە پێی تێڕوانینی خەڵک‌و ناوچەکە بەکاریهێناوە، ئەگینا ناوی یەکێک لە ئۆقیانووسەکانی دەبرد وەک چۆن بۆ ئاسانی تێگەیشتن دەڵێت:

**ســـــروشکی من کە لێڵاوە، غوبـــاری کۆە و هاموونە[1]**
**وەرە سەرچاوەکەم بنواڕە، وەک ئاوێنە، چەند ڕوونە**
"٥٢٠.١٤"

---

١) کۆە و هاموون ناوی دوو شاخی بەرزن لە تورکمانستان. (جگە لەوە دەریاچەیەکی (سیستان) لە ئێران ناوی هاموونە. ئەم زانیارییەم لە مامۆستا جەعفەر وەرگرتووە).

ئەگەر مرۆڤێک ئاوا خۆی لە تانوپۆی ژیان بدات سەرسام نابێت؟ چۆن دەکرێت بە چەند وشەو دێڕێک، یان بە لێکۆڵینەوەیەک کەسایەتیی ئەم مەزنەی دنیای رۆشنبیریی کوردی پێناسە بکەین‌و دیوە نادیارەکانی ژیانی ئاشکرا بکەین؟

چەندین رێگا هەن، کە ئەگەر بۆ مرۆڤ بشێت لێیانەوە هەوڵئەدات تاکو بتوانێت چمکێک لە ژیان‌و هەڵسوکەتی خۆیی‌و کەسانی‌تری پێشی بکاتەوەو تێیان بگات. جا ئەو رێگایانە ئایینی بن، یاخود فەلسەفی‌و زمانەوانی، یان سیاسی، یاخود زانستی بن. بێگومان هەر کام لەو رێگایانە مێژووی دیاریکراو، سنووری کارو تێڕوانینی خۆیی هەیە. هەر یەکێکی پێشتریان لەوی پاشخۆی نوێترە. بەڵام زانست لە هەموو ئەو بوارانە نوێترەو مرۆڤی سەردەم خوازیاری ئەوەیە لەم رێگایەوە بتوانرێت داهێنان‌و بژێوی‌و پێویستی دابینکردن‌و ئاستی پێکەوە ژیان‌و سەربەستی مسۆگەر بکات.

ئەمڕۆ ئێمە لە سەردەمی پێشکەوتنی زانست‌و تەکنەۆلۆژیدا دەژین. کاریگەریی ئێمە بە سەر ئەو لایەنەوەو ئەو لایەنە بە سەر ئێمەوە بە ئاسانی بەدی دەکرێت. بەڵام بۆ ئەو سەردەمەی ئەم مەزنە مرۆڤەی کوردی تیادا ژیاوە، بە هەموو ئەو جیاوازییانەی ئێستاو





ئەوکاتەشەوە مرۆڤ، جگە لە ئارەزووە بایۆلۆژییەکانی بە رادەیەکی کەمتر مەیلی بۆ بابەتەکانی‌تر هەبووە. ئەوجا لە پلەی دووەمدا جیاکردنەوەو گرنگییە تایبەتییەکانی خودی مرۆڤ خۆی هێدی هێدی گەشەیکردووە؛ تێڕوانینی لە ئاسمانەوە خستۆتەسەر زەوی. گرنگترینیان گەشەی ئەزموونە کۆمەڵایەتی‌و مێژووییەکان بووە."٢٣٥.٢٦"

ئەم بابەتە لە توانای درکپێکردنی ئاستەنگ‌و کێشەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی مرۆڤەوە بەرجەستە ئەبێت، هەر ئەو شارەزایی‌و ئەزموونەیە کۆمەڵگا رێکدەخات‌و کرداری بەرەوپێشبردنی مرۆڤ‌و گۆڕانکاریی تیادا ئەوروژێنێت.

**نیشـــانەی پوختەگی بێ دەنگییە (نالی)! ئەگەر پوختەی**
**بە حوججەت طەی بکە نامە، بە حیددەت پەی بکە خامە**
"٤٧٣.١٤"

لە شیعرەکەدا دەکرێت هەر شێوە جووڵەو گۆڕانکارییەکی زیندوو، یاخود بونیادنەرانەی راستەقینەی تێدا دەستنیشان بکرێت. ئەم بوارە زۆر لکو پۆپی لێ دەبێتەوە. ئێمە لەم بەشەدا تەنها مەبەستمانە کەسایەتیی نالی والا بکەین.

نالی وەک بوونەوەرێکی کۆمەڵایەتیی دیار ئەو درک‌و شارەزایی‌و ئەزموونانەی لە خودی خۆیەوە بۆ

مرۆڤی سەردەمی خۆی گواستۆتەوە. تاوەکو ئەمڕۆ ئێمە سوودمەندبووین لێی. ئەو هاوکێشەیەی بە زیندوویەتی ڕاگرتووە بەوەی هەموو کارو چالاکییەکان لە مرۆڤەوە بۆ مرۆڤن‌و ڕادەی گرنگیدان بە مرۆڤ سنووری نەبێت.

گرنگیدان بەم مەزنەی کورد مێژووییەکی دوورودرێژی هەیە. لە نێو تەموومژی نامۆیی‌و نادیاری ئەو مێژووەدا ئەمەوێت باس لە ئاڵۆزترین بابەت بکەم، کە ئەویش کەسایەتیی خودی نالییە. هەوڵی دڵسۆزانەی بەرچاو هەیە بۆ ئەم مەزنەی دنیای ڕۆشنبیریی کوردی. لە دنیادا هەروابووە بیرمەندان، توێژەران لە زۆر بواری مرۆڤایەتیدا پێشئەوەی باس‌و لێکۆڵینەوە بکەن لە چەندین ڕوانگەی جۆراوجۆر دەدوێن. بیری جیاوازیشیان لا بەرجەستە دەبێت. بەو جیاوازییانەشەوە لە زۆر ڕووەوە جارێکی‌تر بە هەر شێوازێک بێت پێکگەشتوونەتەوە، بەڵام هیچ کاتێکیش یەک کلێشەیی‌و یەک دیدی بیریان نەبووە. هەر ئەمەشە بیرمەندو توێژەرانی هانداوە تیۆرو یاساو پێگەی جیاوازی بیرکردنەوە بەکاربهێنن‌و باس و لێکۆڵینەوەی جیا لەسەر کێشەیەک، یاخود ڕەوشێک بنووسنەوە. نالی لەم ڕوانگەیەوە زۆر وردەکارانە بۆ ئەم سۆنگەیە ڕۆشتووەو بە شاکارێک دەکرێت جگە لە واتا





ڕەواڵەتییەکەی بە چەندین شێواز لەو لایەنەوە شرۆڤە بکرێت. دەڵێت:

**ســـەری هەر مووی بەدەنم طەرزە تەمەنناێیکە**
**گـــەردشی نووکی سەرم دوکەڵی ســـەوداێیکە**
**وەرە سەر سەیری صەفاگاهی نەظەرگەی چاوم**
**کە عەجەب مەنظرەیی ســـەیر و تەماشـــاێیکە**
**(١٤–٤٦١)**

لێرەوە هەوڵی دابینکردنی بنەماکانی کارکردن ئەدات بۆ داڕشتنی پلانی خۆشنوودی مرۆڤایەتی. هەر ئەو شێوە هەوڵدانەیە، کە جیاوازییەکان ئەخاتە چوارچێوە زانستییەکەیەوە. بوار بە چەندین بیروبۆچوون‌و ڕای جیاوازی‌تر دەدات تاکو بە یاسا کۆتاییان بێت. مەبەست لە وشەی کۆتایی کۆتاییهاتن نییە، بەڵکو کۆتایی لە لێکۆڵینەوەدا واتەی سەرەتای دەستبەکاربوونە. ئەمە بۆ ئێمە لە باسی نالییەوە ئاشکرایە دینامیکییەتێکی زیندووی بە ژیانی خۆیداوە ئەو کۆتایی‌و سەرەتایەی ئاشکراکردووە و دەڵێت:

**تابەکەی وەک راوییەو، وەک سانییەی سێ پەل شکاو**
**بێ طەواف و ســـەعی و عەمرە هـەر بخەوم و، هەر بخۆم**
**من لـــەوانەم چی کەوا ئــەهلی وەســـیلە و مەسئەلەن**
**عامیل و نـــاچـــار و مـــەعذوور ئـــەر بلێن هەر بێنە بۆم!**
"٣٠٣-٣٠٢:١٤"

هەمان ئەو دەستبەکاربوونو بەردەوامییەیە، کە کەسایەتییو بیرمەندانیتری دنیا گرنگیان پێداوە. ئەو کاتانەی لایەنە مادیو مرۆڤایەتیەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی هاوسەنگیان تێکدەچێت، یاخود بە پێچەوانەوە لە ئەوپەڕی بووژانەوەدان، لێپرسراوێتیی لە سەر هەردوو لایەنەکە وەک نهێنیەک سەرهەڵئەدات، چونکە لە سێبەری شەختەبوونو تاریکستانو تەمومژی لێپرسراوەتیدا، یاخود لە خەوی حەوانەوەو پاڵدانەوەی بێ هەڵوێستیدا، ئەو کەسانەی بەرەو ئامانجێکی چاکسازیو رۆشنبیری مادیو کۆمەڵایەتی رێچکەگرتوو هەنگاودەنێن، هەوڵی تاوتوێی کێشەو گرفتی شارستانی ئەدەن، کە ئەگەر لێپرسراویتییەکە وەک پێویست لە ئەستۆ نەگیرێت ئەوە بارودۆخە شەختەبووەکان دەبنە بەربەست بۆ لایەنە گرنگەکانی ئەو ژیانە کۆمەڵایەتییە. تاڕادەی دانەڕشتنی پلانو دواخستنی بۆ سەردەمێکیتر. هەر دوو رەوشەکە بوار بە شێوازو بیری جیاوازی ئەو لایەنانە ئەدات لێی بدوێی. نالی ئەو شێوە لێپرسراوێتییە شەختەبووانە بەلاوە





ئەنێتو هەڵۆ ئاسا لە بەرزی ئاسمانی زانستو داهێنانەوە باڵەفڕێ ئەکات. بۆ گەیشتن بە ئاشکراکردنی ئەو بابەتە نادیارانەی بوونەتە سەکۆی گفتوگۆی چەندین روانگەی مادیو کۆمەڵایەتی بۆ چارەسەری کێشەو دروستکردنی پەیوەندی نێوان تاکەکەسو کۆمەڵگا، یاخود کۆمەڵگاو خێزانو پاشان بۆ سەر ئاستی دەسەلات، لە بواری زانستە هونەرییەکاندا.

**لێم حەرامە دانەو و ئاوی حەماماتی حەرەم**
**من کە بازی دیدە بازم نەک شەوارەی دەستەمۆم**
"٣٠١:١٤"

یاخود لە شاکارێکیتریدا ئەڵێت:

**بە ظاهیر شادمانیمە لەبەر کەتمی هەموو دەردان**
**کە (نالی) گەر بناڵێنێ ئەمیش نەشئە و سورووریکە**
"٤٦٠.١٤"

لە چامە پڕ بەها سوێیاوییەکەی، کە ناردی بۆ سالمی هاوڕێی ئەو لایەنە هونەرییەی بە چاکی تێدا هەڵهێنجابوو (سالم) لە وەڵامەکەیدا ئاشکرای ئەو تواناو پەیوەندییانە دەکات، کە نالی وابەستەیکردووە بە خۆیو کەسو خێزانو پەیوەندی کۆمەڵایەتیو ئێرکیۆلۆژیو مۆرفۆلۆژیو ژینگەوە، تاکو بە واتاکانی ئەم سەردەمەی

ئەمڕۆ ئەگاتە ئاستی وڵاتو دەسەڵاتی بەڕێوەبردن. (سالم) دەڵێت:

**بۆ موڵکی شامە نامەیی من، سویی (نالی) یە**
**هەر حەرفی ئەو لــە وەضعی ویلایەت دەدا خەبەر**
**پرسیویە ظاهیرەن لە رەفیقانی یــەک جیهەت**
**ئەحوالی ئەهلی شـــەهر و رەفیقانی ســـەر بەسەر**
**لەو سایەوە، کە حـاکیمی بابان بـەدەر کران**
**نەیدیوە کەس لە چیهرەیی کەس جەوهەری هونەر**
"١٤:١٩٩–٢٠٠"

مامۆستا موحەمەد ئەمین هەورامانی بۆ مەولەوی دەڵێت: تێگەیشتن لە مەولەوی مەولەوییەکی ئەوێت. زۆر راستە، بەڵام ئێمە باس لە نالی ئەکەین ئاخۆ تێگەیشتن لە نالی چەند نالی بوێت؟

توێژەرەوانی بواری کەسایەتیی زۆر بە وردی لە کرداری پەیوەندییە ئاڵۆزە جۆربەجۆرەکانی وەک: فێربوون، درککردن، پاڵنەرە سەرەکییە دەرەکیو لاوەکییەکانی تاکەکەس دوواون. بواری توێژینەوەی کەسایەتیی لەسەر کردارێکی سایکۆلۆژی یان کۆمەڵاتی، یاخود جەستەیی دیاریکراو ناوەستێت، بەڵکو لە پەیوەندییەکانی نێوان کردارو رەفتارو چەندین کارلێکی خۆییو بابەتیدا خۆی ئەنوێنێ. هەڵسوکەوتو ئاخاوتنو





رەوشتو مامەڵەی مرۆڤ کارێکی ئاڵۆزە بۆ لێکۆڵینەوە. بۆیە لە کاتی لێکۆڵینەوەی ئەم بوارەدا چەندین تێڕوانینی جۆراوجۆرو چەندین بیری جیاواز بەشداری دەکات؛ ئەمە واتای ئەوەیە تاوەکو ئێستا تیۆرێکی راستودروست بۆ توێژینەوەی کەسایەتیی نییە، چونکە هەرکەسو بیرمەندو زانایەک هەوڵدەدات لە روانگەی بیری خۆیەوە لە مرۆڤو ژینگەی سروشتیو کۆمەڵایەتییەوە لە دابونەریتو بەهاو رەوشتو مامەڵەوە پێناسەی کەسایەتیی بکات. لێرەدا راستە ئەگەر بڵێین پێناسەکانی کەسایەتیی هێندەی ژمارەی گرنگی پێدەرانی ئەبن. لەبەرئەوەی کەسایەتی بە رێکخەری بیرو بۆچوونەکانی تاکەکەس ئەدرێتە قەڵەم. ئەو رێکخستنەش سۆنگەی تواناو شێوازی تێکەڵاوبوونی تاکەکەس لە ژیانی کۆمەڵایەتیدا پێکدێنێت.

(کلاید کلاکهۆن) کەسایەتی بەوە پێناسە ئەکات: "تەواوکاری ئەو نەریتە کردەوەییانەی تاکەکەسە، کە لە رێگای گروپو دەستە کۆمەڵایەتییە جیاوازەکانی وەک خێزانو مەکتەبو ... هتد فێری ئەبێتو بە رۆڵی دیاریکراوی خۆی هەڵدەستێت. ئەمانە بنەی کەسایەتییەکی دیاریکراوی تیادا دروست ئەکەن".(١٨:١٠٤)

لێرەدا کەسایەتی لە رێگای رەفتارو رۆڵ بینینو ئاستی تێگەیشتنو هەڵسەنگاندنی خود لە ناو کۆمەڵگادا

دەرئەکەوێت. لەبەرئەوەی کەسایەتی بونیادێکی کاملّی پێگەشتووە. لەسەر بنەمای هەلّوێست وەستاوە. چەندین ئاستی جیاواز لە خۆئەگرێت، ئەمەش واتای وەلاّمدانەوەی بنەماو بنچینەیەکی گشتگیری کەسایەتیی مرۆڤە بەرامبەر دۆخە جیاوازەکان.(١٠٦:١٨)

(ئوگبێرن) کەسایەتیی بە وابەستەبوونی نەریتە کۆمەلاّیەتییەکانی مرۆڤ خەملاّندووە، ئەو وابەستەییە گشتگیرە لە رێگەی هەستو نەستو نەریتو بیرو بۆچوونو تێکەلاّوبوونی ژینگەی کۆمەلاّیەتییەوە دەردەکەوێت.(١٣٦:٢٢) لای (ماکلیلاند) کەسایەتی بریتییە لەو بۆچوونەی ئەتوانێت لە کارێکدا رەفتاری تاکەکەس پێناسە بکاتو لە هەر ساتەوەختێکیدا بەرەورووی دنیای کەسایەتی بکاتەوە.(٤٠٩:١٠) هەندێکیتریش کەسایەتیی تا رادەیەک بە خەسلّەتێکی رێکوپێکی نموونەیی نەریتو بیرو بۆچوونو باوەڕو بەهاو مۆرکی تایبەت بە کەسێکی دیاریکراوەوە پێناسە ئەکەن. هەندێک کەسانیتر کەسایەتیی بەوە پێناسە ئەکەن، کە بریتی بێت لە دەرەنجامی هەموو ئەو ئەزموونە کەسییانەی بە هۆی ژینگەی شارستانییەوە بەرەورووی دەراوی تێکەلاّوبوونی کۆمەلاّیەتی ئەبێتەوە.(٣٣٥:١٣)





(ئەلّبۆرت) پێناسەی کەسایەتی بەوە ئەکات، کە رێکخستنێکی داینامیکییە لە نێو ناخی مرۆڤدا. ئەو رێکخراوە سایکۆ - فیزیکییەیە، کە شێوازی رەفتاری تاکەکەس دیاری ئەکات بۆ مسۆگەرکردنی هاوسەنگی لەگەلّ ژینگەدا.(٣٥٦:٢) ئەکرێت بەم ریزبەندیانەدا بچینە خوارو چەندین پێناسەی جیاوازی کەسایەتیی بکەین. هەر کەسێک لە ئێمە ئەتوانێت بە پێی بۆچوونی خۆی بەهەندی کەلّەکەبوونی زانینو ئەزموونەکانی خۆی پێناسەیەکی تارادەیەک شیاو بۆ کەسایەتیی دابنێت. بەگشتی کەسایەتیی لە دوو پێکهاتەی سەرەکی مادیو کۆمەلاّیەتی یاخود ستونیو ئاسۆیی پێکدێت، لایەنی بۆچوونو فێرکردنو زانین هەلّیدەسەنگێنێتو دیاریئەکات. بەم لایەنانەش ئەکرێت چەند خەسلّەتێکی دیار بۆ کەسایەتیی نالی دەستنیشان بکەین. لەوانە:

**یەکەم:** نالی لە دنیای شیعرو ئەدەبی کوردیدا بێ هاوتایەو یەکێکە لەو زانا پایە بلّندانەی شەتلّی چەندین بواری رۆشنبیری، شارستانی، کولتووری، مرۆڤایەتی بە زمانی پاراوی کوردی راستگۆیانە چاندووە. کردوونی بە بەردی بناغە بۆ سەردەمی خۆییو پاش خۆیو لە زۆر بواری فەلسەفەو زانستو شارستانی دوواوە. هەولّەکانی ئەم مەزنە بریتین لە کۆمەلّێک دلّسۆزیو بەتەنگەوەهاتنی

رۆشنبیریو شارستانیغه‌تو کولتوورو هه‌وڵدان بۆ دارشتنێکی زانستییانه‌ی زیندوو.

**دووه‌م:** نالی نموونه‌یه‌کی ده‌گمه‌نو سامانێکی نه‌ته‌وه‌یی گه‌وره‌ی وای بۆ به‌جێهێشتووین، که قه‌ڵه‌مو نووسینی چه‌ند لاپه‌ڕه‌یه‌ک، یان لێکۆڵینه‌وه‌یه‌ک نه‌توانێت له تواناکانی ئه‌م مه‌زنه بدوێت. هه‌موو بواره فه‌لسه‌فیو سیاسیو کۆمه‌ڵایه‌تیو مرۆڤایه‌تییه‌کانی به ئاستێکی وایابردووه، که بوون به بنه‌ماو روونمای ئاستی پێشکه‌وتنی ئه‌و سه‌رده‌مه‌و گه‌نجینه‌یه‌کی گونجاوه بۆ ئێستای ئێمه‌و لێی ئه‌دوێین.

بۆیه ده‌کرێت له رێگای وشه‌ئاراییو هونه‌رو ئێستاتیکای شیعره‌کانییه‌وه هه‌ڵسوکه‌وتو چۆنییه‌تی بیرکردنه‌وه‌و که‌سایه‌تیی ئه‌و مرۆڤه مه‌زنه‌ی کوردی پێدیاریبکرێت. ئه‌مه هاوتایه له‌گه‌ڵ تواناکانی نالیدا بۆ تێڕوانینی شایسته‌ی ئه‌و جموجۆڵی هه‌ڵسوکه‌وتو بیرکردنه‌وه ئاشکرایه‌ی که‌سایه‌تیی خۆیی پێناسیووه‌ته‌وه. به ئاشکرا ده‌ڵێت:

**راستیی جه‌وهه‌رییه تیغی زوبانی (نالی)**
**نه‌رم و توند، ئاوی گه‌لوگیره، قصه‌ی پێ ده‌بڕێ**
(٦٥٤:١٤)





**سێیه‌م:** ئه‌توانرێت نالی له ریزی ئه‌و که‌سایه‌تییانه ناونووس بکرێت، که هه‌وڵی پێشکه‌وتنو گه‌شه‌پێدانی شارستانی مرۆڤایه‌تیانداوه. وه‌ک خاوه‌ن بیرێکی داهێنه‌رانه‌ی شایسته باسی بکرێت. بۆ خوێنه‌رو توێژه‌ر هه‌یه ئه‌و که‌سایه‌تییه مه‌زنه له روانگه‌ی پێشکه‌وتنی شارستانییه‌وه به خاوه‌ن بیری پێشکه‌وتوخوازی ئه‌و سه‌رده‌مه‌و گه‌شه‌و پێشکه‌وتنی سه‌رده‌مێکی دیاریکراوی کۆمه‌ڵگای ناونووس بکات. به پێی روانگه‌و بیرو بۆچوونی جیاواز له‌یه‌که به‌یه‌که‌ی به‌نده شیعرییه‌کانی بکۆڵێته‌وه. ئه‌وجا مه‌ودای گۆڕانکاری ئه‌و سه‌رده‌مه‌ی تیادا ده‌ستنیشان بکرێتو بکرێته به‌ردی بناغه‌ی رۆشنبیرییه‌کی پێشکه‌وتوو بۆ ئه‌مرۆ.

هه‌موو شیعره‌کانی نالی ده‌چنه خانه‌ی هونه‌ره‌وه له کرۆکی هونه‌ری به‌ئاگاهاتنه‌وه‌ی یاخیبوونه‌وه نزیکمان ده‌کاته‌وه، یاخیبوون له هه‌موو ئه‌و ره‌وشو رووداوه دزێوه ناوازانه‌ی له ژیانی کۆمه‌ڵایه‌تیدا رووده‌ده‌ن. تاوه‌کو به‌و یاخیبوونه ره‌وتی ژیانی ئاسایی بۆ کۆمه‌ڵگا بگه‌ڕێته‌وه. هه‌ر دێڕێک له شیعره‌کانی نالی جوانییه‌کی بێهاوتای عه‌قڵه‌و به زانستو فه‌لسه‌فه پێودانگ ده‌کرێت.

**ئه‌حوه‌لی ته‌فره‌قه نه‌ظه‌ر ته‌قوییه‌تی سه‌به‌ب ده‌کا**
**عاریفی وه‌حده‌ت ئاشنا له‌م قسه‌یه ئه‌ده‌ب ده‌کا**
(٩٧:١٤)

کەواتە لە خۆیەوە نییە، کە دەڵێت:

**(نالی) ئێستە تاجی شاهیی و تەختی خاقانیی هەیە**
**شەوکەت ئارا، موحتەشەم دیوانە، فیکرەت صائیبە**
**(٤٠٠:١٤)**

زۆربەی ئەو وشانەی بەکاریهێناون، بەندن بە سۆسیۆژیو ئێرکیۆلۆژییەوە. واتاو گەورەیی مرۆڤمان بۆ شرۆڤە دەکات. لێرەوە گەورەیی کەسایەتیی نالی خۆی نیشان ئەدات، کە لەو سەردەمەدا کەس وەک نالی بەو شێوازی هەوڵو خۆێندنەوەیەدا تێنەپەڕیووە. پەی بە گرنگیی ئەو راستییانە نەبردووە. بۆیە بەرهەمەکانی ئەم مەزنە بێمنەتە بۆ هاتنو بەدواداچوونی جۆراوجۆری زانستییانە. نالی لە داڕشتنی پلانو نەخشەو بۆچوونی ئاسودەیی بۆ پێشکەوتنو گەورەیی کۆمەڵگاکەی مێژووی تۆمارکردووە. بگرە رۆشنبیریی نەتەوەو وڵاتیشی بە نەمری هێشتۆتەوە. لە داڕوتانو چەقبەستن رزگاریکردوون، چونکە ئەم مەزنە عاشقی وڵات بووە. هەر لەو عەشقەیەوە بۆ وڵات دەڵێت:

**دڵ سیاسەنگ نەبێ، مائیلی خاکی وەطەنە**
**خاڵی لەعلی حەبەشە، ساکینی بوردی یەمەنە**
**(٥٢٤:١٤)**





واتای ئەوە ئەگەیەنێت هەموو شتێکی لە وڵاتەکەیدا خۆشویستووە. خۆ ئەگەر خۆشەویستی بچێتە ناو دڵەوە ئەوە جێگەی رقو کینەی تێدا نابێتەوە. خۆ ئەگەر کرۆکی خۆشەویستیی خود، وڵات، نەتەوە دیاریکرا ئەوە هەموو ئەو ئەستێرانەی لە هەر وڵاتێکیتری ئەم جیهانەدا کەسانی بە تواناو برەودەری گۆڕانکارییە بنچینەییەکانو دێنە ریزی نالیو دەرئەکەون.

توێژینەوەو شرۆڤەکردنی بابەتەکانی نالی لە رووی چەندایەتییەوە بۆ باری دەروونیو زانستو پۆلێنکردنی ئەم لایەنانە کۆمەڵێک کڵێشەی چۆنایەتی خودی ئەم مەزنەمان بۆ روونەکاتەوە. لە هەمانکاتدا چۆنییەتی خەسڵەتی کردارو رەفتارە بەدەستهێنراوەکانی ئەم کەسایەتییەمان لە لایەنی چەندایەتییەوە بۆ دەردەخات.

**فارس و کورد و عەرەب هەر سێم بە دەفتەر گرتووە**
**(نالی) ئەمڕۆ حـــاکمی سێ موڵکە، دیـوانی هەیە!**
**(٥٧٧.١٤)**

**چوارەم:** نالی شاعیرێکی پایەبەرزو بێهاوتای دنیای شیعری کوردییە. هەر لە سەدەمی خۆیەوە تاوەکو ئێستا پلەو پایەی ئەو مرۆڤە وەک ئەستێرەیەکی درەوشاوە بە ئاسمانی دنیای رۆشنبیریی کوردییەوە دیارە. زۆربەی

هۆنراوەکانی لە ئاستی رونبیری‌و زانیارییەکی وادان تێڕوانینێکی تایبەتی بۆ تێگەیشتن دەوێت.

کەم کەس هەیە بتوانێت بە یەکجار مەبەست‌و خواستی نالی لە بۆچوونێکدا شیبکاتەوەو وەکئەوەی، کە خۆی مەبەستی بێت تێیبگات، هەر وەک نالی خۆی ئاماژەی پێداوەو دەڵێت:

**(نالی) بە داوە شەعری دەقیقی خەیاڵی شیعر**
**بۆ ئەو کەســـەی کە شاعیرە صەد داوی نایەوە**
(٥٥٥:١٤)

ئەوەندە بە وردی چۆتە نێو دنیای ماریفەتەوە، کە ئەتباتە ناو دنیایەکی دەروونی‌و فەلسەفیی ئەوتۆوە لە گرێوگۆڵی ژیانی تاکڕەوی دەرباز ئەبیت. بە ناچاری لەگەڵ گشتدا یەک ئەگرێتەوە. نالی خۆی زۆر بە ئاشکرا ئاماژەی بەم لایەنە داوە دەڵێت:

**من سەروی ڕەوانی چەمەنی عالەمی باڵام**
**(نالی) بە طوفـەیلی بووەتە سـایە لەدوو من**
(٣٣٢:١٤)

یاخود لەم شاکارەدا بەکام شێوە لەم لایەنەوە خۆی لە لوتکەدا دەسەپێنێت:





**ئیثباتی خەط و خاڵە، بەصەد شوشتن و گریان**
**ناچێتەوە ئـــەم نوقطە لە نێو دیـــدەیی تەڕدا**
(٨١:١٤)

ڕواڵەتی واتاکان لە شیعرەکانی نالیدا ئاشکرایە، بەڵام گوزارەکانی‌تریان ئەمانبەنە نێو دنیای فەلسەفەو زانستەکانی‌ترەوە. پەلکێشی ڕۆشنبیری ترمان ئەکات. لەو سەردەمەوە تاکو ئێستا شیعرەکانی نالی پڕن لە حیکمەت‌و پێکانی نێوەڕۆکی کۆمەڵایەتی. سیستەمی باوی ئەو سەردەمەی کردۆتە وانەی بەسوود. بۆ ئەمڕۆش ئەبنە هەوڵدانێک بۆ سازاندن بە بەلاوەنان‌و راستکردنەوەی ناجۆرییەکان. پشوویی جەستەیی‌و ئارامی بۆ بیر بەرجەستە ئەکەن. ئەویش لە ئەنجامی ئاوێتەبوونی ئەو توانایيە فیسیۆلۆژی‌و هۆکارە ژینگەیی‌و رۆشنبیری‌و زانیارییە تایبەتیانەوەیە، کە خودی نالی بە دەستی هێناون‌و کردوونییتە داهێنان لە شیعرەکانیداو بە لای خۆیاندا راپێچمان دەکەن. ئەمە تێڕوانێکی جوان بە کەسایەتیی نالی دەبەخشێت. ئەم خەسڵەتە توانیوییەتی ناخی کەسایەتیی تایبەتی نالی بهەژێنێت‌و کاری تێبکات. ئەو کاریگەرییە بۆ دەرەوەی خودی خۆی بگوێزێتەوە، وەک ئەو نامەیەی بۆ مردنی باوکی حەبیبەی نووسیووە. ئەمیش (نالی)، کە وەک حەبیبە ئەگری. بەڵام نالی گەورەییەکەی خۆیی لە گەوهەر رشتندا ئاماژە پێداوە.

**بۆ گریەیی تۆ ڕەنگە منیش هێندە بگرییێم**
**گەوهەر بڕژێنین بە بوڵندیی قەد و باڵات**
(١٣٩:١٤)

یاخود ئەوکاتەی وەڵامی نامەکەی برایم پاشای میسر ئەداتەوە:

**میرود نالی أز أینجا چو حریص أز دنیا**
**با لب خوشک و کف خالی و چشم پر نم**
(٣١٣:١٤)

هەر چەندە ئەم نامەیە بە نەبوونی پێکهاتەکانی سیستەمی کۆمەڵایەتی کوردەواریماندا شۆڕدەکاتەوە. (بە پێچەوانەی سەردەمی عەباسییەکانەوە، کە تاوەکو کام ئاست موتەنەببیان بەلاوە گرینگبووە. بە تایبەتی دوای ئەوەی لە دەسەلاتی عەباسییەکان زویردەبێتو ئەچێتە شام تاکو پارێزگاری گرنگییەکەی بکرێت). ڕێکخستنو گرینگیدان بە فاکتەرەکانی ژیانی کەسایەتیی نالی ئاشکرایە، کە تا چ رادەیەک توانیویەتی هاوسەنگیو هێزو دینامیکییەتی ئەو کەسایەتییەی خۆی بپارێزێت. واتە هەستو سۆزو خۆشەویستیی تەواوی ئەم کەسایەتییەمان پێ ئەناسێنێت.





**وەرە سەیری خیابان و بەیاضی دەفتەری نالی**
**کە صف صەف، مەصرەعی بەرجەستە، ڕیزی سەروی مەوزوونە**
(٥٢٣:١٤)

پێویستە وا لە کەسایەتیی ئەم مرۆڤە مەزنەی کورد وردبینەوە، کە ئەو سەردەمەو تەنانەت پێش خۆیشی لەو مێژووەدا. لەو بستە قەڵەمڕەوەی خاکی کورداندا. نالی یەکێک بووە لەو کەسایەتییە دیارانەی سروشتی مرۆڤایەتیی تییدا هەڵسەنگاندووە. ئازایانە بەرەنگاریی گێچەڵەکان بۆتەوەو بیری خۆی لە سەر داڕشتوون، چونکە وشەیەکی بێ مەبەست لە شیعرەکانیدا بەدی ناکەین. رستەیەک نییە بە واژە کۆمەڵایەتیو رەوانییەکان لە بابەتێکی فەلسەفەی ژیانی راستەقینە نەدوێن. چەندین بابەتی ئاڵۆزی کرۆکی مرۆڤی واڵاکردووە. تاوەکو ئەم سەردەمەش کەسێکی ئاوا جەربەزەو خاوەن بیرێکی کراوەو خولیای پێشکەوتنو داهێنانو دەسگیری نەتەوەکەمان. بە شێوە زمانێک پێشتر پەی پێنەبراوە، شک نابەین. کەس بەو ئازایەتییە خۆی لەو بابەتانە نەداوە. ئەگەر ئەو نەبووایە خۆ تاکو ئێستا لەوانەبوو تورکیو عەرەبیو فارسی ببوونایە بە شێوازی نووسینەکانمان. ئەگینا بۆچی ئەوە چەندین ساڵە ملیۆنان خەڵک داوای یەک شێوە نووسینی کوردی ئەکەن؟

نالی لە دڵسۆزی بۆ خاکو نەتەوەکەی ئەو داهێنانە گەورەیەی بەرجەستەکرد.

**کەس بە ئەلفاظم نەڵێ خۆ کوردییە خۆ کردییە**
**هەر کەسێ نادان نەبێ خۆی طالیبی مەعنا دەکا**
**(١٠٧:١٤)**

ئەو هەموو هەڵوێستو زانیارییە زمانەوانیو خۆشەویستیو وڵاتو ئایینو خۆشنودیو خەمۆکیو بێ ئومێدیو تێڕامانو عەشقو گەشەو گۆڕانو نۆژەنبوونەوە مادیو کۆمەڵایەتییەی سروشتو مرۆڤ، کە لای نالی بەبێ زۆر لە خۆکردن لە رووی بیری خۆیەوە هاتوونەتەکایەوە. کردوونی بە پێگەی بزووتنەوەی شیعری کلاسیکی کوردی.

تاوەکو لەم مەزنە رامێنی لکو پۆی جیاجیاو تەرزی نوێت لا بەرجەستە دەبێت:

**بەحثی سیڕڕی دەهەنی نوقطە بە نوقطە بگەڕێی**
**ســـەری مووێی نییە بێ نوکتە لە دیـــــوانمدا**
**(٩٢:١٤)**

ئەم لکو پۆو چڕوپڕیو زانیاریانە هەندێکجار جیاو هەندێکجار ئاوێتە بە یەک دەبن. وا لە مرۆڤ دەکەن لە بەرزیی کەسایەتیی ئەم مەزنەوە بکەوێتە هەڵشێلان،





تاوەکو ئاشنایەتییەکی نوێ بهێنێتەکایەوە. بەڵام هەر ئەوەندەیە دوایینجار ئاوێزانی مرۆڤو ژیانە پڕ واتاکەی ئەبێتو بیروڕای سەربەستو مەبەستداری پێشانو ئێستای وەک پێداویستییەکی گرنگ نیشانئەدات، دوارۆژێکیتر ئەبینێت. ئەبێتە بناغەو شێوازێکی شایستەی رەنگاوڕەنگی رۆشنبیریو شارستانیو کولتوور، کە وەک پێویست بۆ دەوڵەمەندبوونی بیرو گەشەی بونیادی نەتەوەکەمان بەردەوام لە سەری بدوێینو لێیبکۆڵینەوەو هەرجارەی ئاشنابوونێکیتر لە فەرهەنگی نەتەوەکەماندا بەرجەستە ببێتو بابەتی نوێی لێهەڵبهێنجرێت.

لەم رووەوە نالی لە ترۆپکی شیعرو تێڕوانینو بیرو بۆچووندا بۆتە هەوێنی پێگەیاندنی چەندین کەسایەتیو شاعیر، کە خۆی بە سەریانەوە وەستاوە. ئەمە تێڕوانینێکی هەرمییە تاڕادەیەک وەک تێڕوانینی پێشتر وایە. بەڵام ئەمەیان لە سەرەوە دەستپێدەکات بۆ خوارەوە. واتە نالی لە ترۆپکی بابەتەکاندا وەستاوە. هەر پیاداهەڵگەڕانێک بۆ سەرکەوتن لایەنی رێکخستنی کەسایەتییەکەیی تیادا دەرئەکەوێت، کە تا چ رادەیەک هەوڵی رێکخستنی ئامانجەکانی ئەداتو گرنگی بە روونکردنەوەو خۆناساندنی شایستەی خۆی ئەدات.

**(نالی) مەثەلی حاڵی لە ئەشکەنجەییی غەمدا**
**وەک ناڵە لە نەیدا، وەکو نالە لە قەڵەمدا**
(٩٥:١٤)

خۆگونجاندن لەگەڵ ژیانی مرۆڤایەتیدا واتای تێگەیشتنێتی؛ تێگەیشتنێکی بابەتییانە بۆ مەبەستی قبوولکردن‌و زاڵبوون بەسەر گرفت‌و ئاستەنگەکاندا. ئاشکراکردنی شێوازی پەیوەندیکردن رێگایەکی گونجاوە بۆ پێشکەوتنی مادی‌و کۆمەڵایەتیی شارستانییەت‌و گەیاندنی بە دەوروبەر. ئەم خۆگونجاندنەیە بنەمای پێشکەوتنی توانایی‌و دەسەڵاتی بیر دیاریئەکات. بەرهەمەکانی نالی لە ژینگەیەکی سروشتی‌و کۆمەڵایەتی ئەو شێوازە گونجاوەوە هەڵقوڵاوون. ئەم شێوە تێڕوانینە ئەکرێت وەک میکانیزمی خۆگونجاندنی کەسایەتیی نالی لێی‌بڕوانین بۆ دەستنیشانکردنی توانایی بەرەوپێشچوون‌و سەرکەوتن‌و بەردەوامبوون. لێرەدا دەکرێت کەسایەتیی نالی لە ئاستی گونجاندن‌و سازاندنەوە سەیربکرێت، کە تا چ رادەیەک بە دەستی هێناوە.

**قەللابی جیهان نەقدی عەیاری نییە قوربان!**
**(نالی) مەحەکی هیمەتی کردوویە موجەڕڕەب**
(١٣٦:١٤)





سەرچاوەو فاکتەری گۆڕانکاری زۆرن بۆ بەرەوپێشبردن‌و پێگەیاندنی کەسایەتی. هەر کەسێک لە شوێنی خۆییەوە دەتوانێت تووی بونیادنان‌و گۆڕانکاری بچێنێت. بەڵام وەڵامدانەوەی ژینگەی مادی‌و کۆمەڵایەتیی کۆمەڵگا گەشەپێدەرو رێکخەرن بۆ جیاکردنەوەو پێکەوە بەستنیان.(٦٥:٢٨) تێڕوانینێکی لەم شێوەیە بۆ کەسایەتیی نالی ئەو خسڵەتە تایبەتییانە جیادەکاتەوەو کەسایەتییەکی دیاری لە نێو کۆمەڵگادا پێ دەبەخشێت. گرنگیی کەسایەتییەکەی بە پێی رادەی دەرکەوتنی جیاوازیی تواناکانی دەرئەکەوێت. لەم لایەنەوە نالی خۆی درکی بەو تواناییەی کردووەو دەیەوێت بە خەڵکیش بڵێت من دڵنیام.

**(نالی) یەک و ئەو کەس، کە تامی غەزەلی بیست**
**مەعلومی بـــووە زۆر و کـەمی خاریقی عـادات**
(١٤٤:١٤)

یاخود دەڵێت:

**(نالی) کە غولامی مەدەدی زولف و برۆیە**
**شاهێکە لە بن سایەیی باڵی دوو هومادا**
(٨٦:١٤)

ئەم پۆلێنەی سەرەوە لەگەڵ چەندین زانستیتردا ئاوێتەدەبن‌و هەموو پێکەوە یەک دەگرنەوە پێشکەوتن‌و

گەورەیی کەسایەتیی نالی لە نێو کۆمەڵگادا زیاتر دەردەخەن.

ئەم تێڕوانینە لەوانەیە لە دیدی فرۆیدەوە نزیکبێت بەوەی، کە سێ لایەنی بۆ کەسایەتی دیاری کردوە، ئەوانیش (ئەو، من، منی باڵا)ن، کە ئەو لێرەدا بریتیە لە یەکەی وێرانکاری، لە هەمان کاتیشدا بونیادنەرە. منی باڵا رەوشتو بەها کۆمەڵایەتییەکان لە خۆ ئەگرێت. من راڕاو هاوسەنگی ئەو لەگەڵ منی باڵایە. لە رێگای هەستو نەستو پێش هەستەوە ئەم دۆخانە رێک ئەخات. ئەمە دیدیکی جیاوازە لەو بۆچوونەی ئێمە مەبەستانە.

**نوصحی (نالی) ڕەنگە هەر کەس بیبیێ، بیکاتە گوێ**
**چونکە نەظمی صـاف و وردە، هەر وەکوو مـرواریيە**
(١٤: ٥٨٢)

❊❊❊

**ڕۆشنبیری لای نالی**

باسکردن لە ڕۆشنبیری پەلکێشی زۆر بابەتی مێژووی پێشکەوتنی مادیو کۆمەڵایەتی کۆمەڵگامان دەکات[٢] نموونەی پیشاندانی ئەو لایەنانە لە شیعرەکانی نالیدا زۆرن. ئەو ڕاستەوخۆ وابەستەی لایەنی ڕۆشنبیری، شارستانی، کولتووری کۆمەڵگاو پێگە جوگرافیەکەی بووە. باسکردن لە ڕۆشنبیری، شارستانی، کولتوور، سەنگی مەحەکی شرۆڤەی پێودانگی ژیانی کۆمەڵگا ئەخاتەڕوو، ئیتر ئەگەر ئەو کۆمەڵگایە سەرەتایی بێت، یان دواکەوتوو، یاخود پێشکەوتوو بێت. ڕۆشنبیری،

[٢] هەر لەو کاتەوەی مرۆڤ لە ڕێگەی بوونی دەستەکانییەوە، کەوتۆتە ڕەوتی دژایەتیو لەگەڵ سروشتدا بۆ زاڵبوونو خۆگونجاندن جەنگاوە. هەر لەو سەردەمەوە پێویستی بە شیعر هەبووە تاکو ئاواز بە دەنگی دەربکاتو گۆرانی بچڕێت، بۆ ئەم سەردەمەش هەمان حاڵە بە شێوازێکیتر، چونکە مرۆڤ بەردەوام سەرقاڵی کارو پیشەو هەوڵەو ڕەنج ئەدات، دیارە ئەمانە مرۆڤ شەکەت ئەکەن، کە ئەگەر بە ڕەواڵەتیش بێت پێویستی بە جۆرێک حەوانەوەو پشوودان ئەبێت، بۆ ئەوەی بیرو هۆشو جەستەو بیرو وزەی نوێی تیادا ببوژێنێتەوە. ئەوەی پەنای ڕێزو دڵسۆزی مرۆڤ بێت بێ کاسەلێسیو بێ زۆر لە خۆکردن، ئەوە هونەرە جوانەکانی وەک شیعرو گۆرانی ڕاستەقینەیە، کە خزمەتی ویژدان بکات. ئەم لایەنە پێویستیەکی گرنگە بۆ ئازاد بوون بۆ وەبەرهێنانەوەی هەناسەی ئاسودەیی تا وزەو تواناکان لە ڕۆتین ڕزگاریان بێت. هەر هیچ نەبێت ورەیەکی مویزیکی لە دوتوێ ویژدانی مرۆڤایەتیەوە بپشکوێنێ.





شارستانی مرۆڤ خۆی دروستیکردوون. هەر خۆیشی دەتوانێت پێشیان بخات، هەوڵی گۆڕانکارییان تیادا بدات، ڕایانگرێت، ڕەخنەیان ئاراستە بکات. تاوەکو ئەمڕۆ پێناسەیەکی گشگیر نیە بۆ ئەم دیاردەیە، کە بتوانێت سروشتی سەرچاوەی پێکهاتەکانی ئاشکرابکات. بۆیە هەر کەسو بیرمەندێک بە پێی ئامانجو شێوازی بەدواچوونی خۆی ڕۆشنبیریو شارستانیو کولتوور جیادەکاتەوەو پێناسەیان دەکاتو لێیاندەکۆڵێتەوە. تێڕوانینی ئێمەش تاکو ئەمڕۆ لە سەر ئەم سێ لایەنە جیاوازە. بۆ نموونە هەندێک نالی لە بواری وشە ئاراییو جوانناسیو هونەری ڕەوانبێژییەوە سەیرئەکەن. هەندێکیتر لە ڕووی فەلسەفیو ئایینیەوە. هەندێک لە ڕووی زانستو هەندێکیش هەن هەمووی پێکەوە ئەبەستنەوەو پیودانگی ئاستی ڕوونبیریی نالی پێدەکەن. هەر ڕوویەکیان هەڵبژێرینو باسیان بکەین ئەوە لە ناوەڕۆکدا تایبەتمەندیی ڕۆشنبیری گشتی کۆمەڵگا خۆییمان بۆ ئاشکرائەکات. ئەم تایبەتمەدێتیانە لە سۆسیۆلۆژیادا بە پێکهاتەکانی ڕۆشنبیری، یاخود شارستانی، یان کولتوور ناوزەندکراوە. ئەکرێت بۆ زیاتر ئاشنابوون کورتە ئاماژەیەکیان پێبدەم. ڕۆشنبیری لە کەفو کوڵی بیرو بۆچوونی ناوەوەی خودی مرۆڤەوە دروست دەبێت.

لەبەرئەوەی پێوستی پێیەتی، نەک بۆ مەبەستی بەرژەوەندی. رۆشنبیری شۆڕەندی بەهای باوی کۆمەڵگایەو خۆی پێودانگی خۆیی پێئەکات. پێودانگی پێهاتەکانی رۆشنبیری ئاڵۆزن. بە پێی بۆچوونی زۆربەمان رۆشنبیری خۆی لە بازنەی بەهاو نەریتو باوەڕو رەوشتو زانستو هونەرو زانستی کەسی ...هتد ئەبینێتەوە. خەسڵەتی دەستاودەستکردنو گواستنەوەو سنوور بەزاندی تێدایە. مەرجی تێگەیشتن لە ترۆپکیدا وەستاوە. ئەمە لە وابەستەیی بیرو توانایی بیرکردنەوەی شیاوو ئەزموونی مرۆڤایەتیەوە کەڵەکە بووە. شارستانی لایەنە مادیەکانی رۆشنبیریە، واتە ئەو گوزارشتانەیە، کە لە بیروبۆچوونو بیری مرۆڤدا بەرجەستەبوون، گوزارشی مرۆڤە لە بوونو کۆمەڵگا. بۆیە خۆی لەو شتانەدا دەبینێتەوە، کە پێدوایستی دابینئەکەن، وەک: خواردن کەرەسەو پۆشاکو ماڵو خانوبەرەو هەموو ئەو شتانەی لە بەکارهێنان یاخود بەرهەمداری، یان خزمەتگوزاریدا بوونی مادییان هەیەو هەن. هەردوو لایەنەکە لە چەند بەشێک پێکدێت، پێکاهاتەی هەر بەشێکیان بەوەی تریانەوەبەندەو لە هەمان کاتیشدا سەربەخۆیی خۆیانیان پاراستووە [٣٠٥:٢٩]. لە هەر بەشێکییاندا سێ یەکەی بچووکی کارای تیادا بەشدارە:





**یەکەمیان:** لایەنی درککردنە. ئەم لایەنە لە زانستی ئاسایی مرۆڤەوە تاکو ئاستی پێشکەوتنە تەکنەلۆژییەکان هەڵدەکشێت، بۆئەوەی بتوانێت ئەو بیری درککردنەکە لە بەرهەمهێنانو بەکارهێنانو خستنەڕووی راستییە مادیو کۆمەڵایەتیەکاندا ئاشکرابکات.

**دوومیان:** یەکە مادیەکانە. رایەڵەی ئەم یەکانە هەموو ئەو ئامێرو ئامرازو کەرەسە مادییانەی داهێنراونو دائەهێنرێنو بەکاردێن، کە بەشداری کارا لە ئاڵوگۆڕو گۆڕانکاری بیرو زانستو تێگەیشتنی نێوان مرۆڤو ژینگەکەیدا ئەکەن.

**سێیەمیان:** یەکە پێودانگییەکانە. هەموو ئەو پێودانگو بنەمایانە دەگرێتەوە، کە هەڵسوکەوتو مامەڵەی راست، هەڵە، سزا، پاداشت، گرنگیدان، بەتەنگەوەهاتن، ئاستی تێگەیشتنو ...هتد رێکئەخات. پێودانگی پلەی پێشکەوتن، یاخود دواکەوتەیی بە پێی سەردەمەکە دیاریدەکات [٨٩:٢٥].

ئەم لایەنە بە ئاسانی لە شیعرەکانی نالیدا ئەتوانرێت رەچاو بکرێت. نالی توانیویەتی بنەماکانی رۆشنبیری بە پەیوەندیە کۆمەڵایەتیەکانی مرۆڤەوە وابەستە بکات. شێوازی یاساو رێکخستنو پێداویستی گرنگی سیستەمی نووسیینو پەیوەندی لای نالی پێکهێناوە. ئەمانە دەچنە خانەی رۆشنبیریو

شارستانییەوە. ئاماژەی ئاستی پێشکەوتنی مادیو کۆمەڵایەتی یاخود دەرخستنی پلەی گرنگیدانە بە رەواڵەتو ناوەڕۆکی ئەو بوارە. زۆر نمونەی ئەو جیاکاریو یەکە کارایانە لە شیعرەکانی نالیدا هەن. بۆ نموونە لە ٢٣ بەیتی باسی حوجرە شەقوشڕەکەیدا دركکردنی مادیو پێودانگو رۆشنبیریی باوو پلەی پێشکەوتنی رۆشنبیریو شارستانی خسۆتە روو دەڵێت:

**وەک قەفەس ئەم حوجرە کون تێیە کەوا گرتومیە ناو**
**تـــارو پۆیی عـــەنکەبـــوتە، زۆرە لێی کـــردومە داو**
**(٣٥٥:١٤)**

لەو سەردەمەدا لە ئەوروپادا (دێر)ەکان بە جوانترین شێوازی ئەندازیاری دروستئەکرانو بنەی رۆشنبیریو شارستانییەتیان تیادا ئاڵوگۆڕ ئەکرا. بە بەهاترین بابەتی هونەری بە ناویدا پەرش ئەکرایەوە. بە پێچەوانەی کوردستانەکەی ئێمەوە، کە لەبن بەردو نێو ژووری رووخاودا زاناو دانا پێئەگەیین.

زانای ئینگلیزی (تایلۆر) زاراوەی رۆشنبیری، شارستانی لە کتێبی (رۆشنبیری، شارستانی، سەرەتایی) لە ساڵی ١٨٧١دا بەکارهێناوە. ئەڵێت: "رۆشنبیری، شارستانییەت، ئەو یەکە گرژو ئاڵۆسکاوەیە، کە هەموو تەرزەکانی زانستو باوەڕو رەوشتو فەلسەفەو هونەر لە





خۆی ئەگرێتو مرۆڤ وەک ئەندامێک لە نێو کۆمەڵگاکەی خۆیدا هەموو توانا بەدەستهێنراوەکانی لەگەڵدا تێکەڵاوئەکات"(٤٥:٢٤).

بەو واتایە بێت ئەم لایەنە کار لە رێکخستنی زۆربەی ئەو دیاردانەدا ئەکات، کە دوورو نزیک وابەستەییان بە مرڤەوە هەبێت. ئاماژەیەکی کورت بە چەند پێناسەیەکی رۆشنبیری - شارستانی هەندێ لایەنمان بۆ روونئەکاتەوە، کە رۆشنبیری بریتییە لە کۆی ئەو شێوازو رەفتارە بەدەستهێنراوانەی زۆربەی زۆری کۆمەڵگا بەلایانەوە پەسەندە. ئەم پێناسەیە هەموو شێوازە بەدەستهێنراوەکانی رەفتاری مرۆڤ لە کۆمەڵگادا دەگرێتە خۆیو خەسڵەتێکی کۆمەڵایەتیان پێ ئەبەخشێت. هەندێک کەسانیتر پێیان وایە رۆشنبیری هەموو شێوازەکانی رەفتارو بیرکردنەوە مادیو کۆمەڵایەتیەکان پێکەوە ئەگرێتە خۆی. لەبەرئەوە هەر بنەیەکی مادی، کە مرۆڤ دروستی کردبێت چمکێکی رۆشنبیری تیابەشدارەو خۆی وەک شارستانی پێناسە ئەکات، واتە هەموو لایەنە مادیو مرۆڤایەتییەکانی کۆمەڵگا ئەگرێتە خۆ. بەو واتایەی لە سیستمی کۆمەڵایەتیو داڕشتنی زمانو ئابووریو خێزانو سیاسەتو ئایینو ئاکارو سیستمی خزمایەتیو نەریتو هونەرو تەکنەۆلۆژیو بەهاگشتییەکان بەشداریی

ئەکات.[١١٢:١] ئەو رەفتارانە بە شێوازی تایبەتی لە خۆیدا کۆئەکاتەوە ئەیانلکێنێت بە دنیای بیرکردنەوەوە، یاخود بەو ئیدیاڵەوەی کۆمەڵگا باوەڕی پێیەتی.[١٢٠:١١]

ئەم بنەمایانە لە واقیعی ژیانی کۆمەڵایەتیدا ناتوانرێت راستەوخۆو سەربەخۆ بەدییان بکەین، بەڵکو هەموویان لە بارێکی ئاوێتەو ئاوێزانی یەکتردان‌و بە جۆرێک لێکئالاون، کە زۆر کرۆڵە بتوانین جیاوازیە مادی‌و کۆمەڵایەتیەکانیان دەستنیشان بکەین. ئەمەش گرنگیی توانایی زمانمان بۆ ئاشکرا دەکات، کە چۆن تانوپۆی ئەو بابەتانەی لە ئاستێکی رۆشنبیری بەرزدا دەنەخشێنێت‌و هەمووی لە لایەنە کۆمەڵایەتیەکەدا شیئەکاتەوە.

توانایی نالی لەو چامەدا، کە لە شامەوە بۆ سالمی هاوڕێیی بە رێ کردووە، دیارە، چۆن گشت بابەتەکانی بە جیا باسکردووەو لە کۆتایشدا هەموویانی پێکەوە بەستۆتەوە. خوێنەر دەتوانێت تەواوی چامەکە لە دیوانی نالی‌دا بخوێنێتەوە، لەو شاکارە سوییاویەدا لە بنەی دروستبوونی مرۆڤەوە لە (ئاوو هەواو گڵ) پەیوەندی هەموو ئاسەوارە مادی‌و کۆمەڵایەتیەکانی بە رۆشنبیری‌و شارستایەتی ئەو سەردەمەوە، تا کۆتایی (نەفخی سوور) ئاماژە پێداون:





**قوربانی تۆزی رێگەتم ئەی بادی خۆش مروور**
**ئەی پەیکی شارەزا بە هەموو شاری شارەزوور**
(١٧٤:١٤-١٩٧)

ئەوکاتەی کۆرپە لە دایک دەبێت، وەک مرۆڤێک پێویستیی بە چەندین فاکتەری مادی‌و کۆمەڵایەتی ئەبێت، تاوەکو گەشەو پێگەیاندن لە رووی خواردن، خواردنەوە، دەستگیری، بەرێدا رۆیشتن‌و قسەکردنی تیادا پێدەگات. بە شێوازو چۆنیەتیی کاروکردەوە کۆمەڵایەتییەکان ئاشنا ئەبێت‌و ئەکەوێتە نێو ژیانی کۆمەڵایەتی‌و بەرەوڕووی لێپرسراوەتی مێژوویی ئەبێتەوە.

زۆر پێناسەی جیاواز بۆ لێکدانەوەی ئەو لێپرسراویتیەی رۆشنبیری، شارستانی هەن. لەوانە پێناسەکەی (کلایدکلاهۆن) ئەڵێت: رۆشنبیری، شارستانییەت ئەو نموونانەیە، کە بە شێوەیەکی دیارو بەردەوام لە سەردەمێکی مێژووییدا لە هەر دوو بواری دیارو نادیارەوە لە لایەنی بیرو هەستەوە گەشەی کردووە. ئەم رەوشە لە هەموو کۆمەڵگایەکی مرۆڤایەتیدا هەیە. رۆشنبیری ئاماژەیەکە بۆ رێنمایی پێودانگی رەفتاری ئەندامانی کۆمەڵگا[٧٩:١٠].

(مالینۆفسکی) دیدێکی‌تری هەیە بۆ ئەم لایەنە. ئەو لە روانگەی ئەرکەوە لە رۆشنبیری ئەڕوانێت بە باوەڕی ئەو رۆشنبیری ئەو بوونیادە ئاڵۆزەیە، کە بە هەموو ئەو

کەرەسەو یاسا کۆمەڵایەتیانەی لەبەردەستیدایە هەوڵی ڕێکخستنی ژیانی کۆمەڵگا ئەدات، بیرو باوەڕو بەهاو نەریتە مرۆڤایەتیەکان پێکئەهێنن، ئەوانە هۆکارێکی گەورەن بۆ مرۆڤ تاکو بتوانێت خۆی لەگەڵ ژینگەدا بگونجێنێتو چارەسەری کێشەو گرفتە جۆراوجۆرەکانی بکات(١٢٠:١٦).

ئەوەتا نالی لەو ڕوانگەیەوە چەندین جار لە شیعرەکانیدا هەوڵی جیاکردنەوەی ڕەهەندی مادیو کۆمەڵایەتیو باوەڕو ...هتد داوە. لەوانە لە شیعرێکی حەڤدە بەیتدا ئاماژەیەکی ئیجگار ورد بە جیاوازیەکانی کچو کوڕ دەدات، کە لە کرۆکی ئەو جیاوازیانەدا وەزیفە سەرەکییەکە دەرئەکەوێت. دەڵێت:

**عیشقت، کە مەجازی بێ، خواهیش مەکە ئیللا کچ**
**شیرین کچ و لــەیلا کچ و سەلما کچ و عەذرا کچ**
(١٥٧:١٤)

تاکو ئەگاتە کۆتایی شیعرەکەو دەڵێت:

**بابێکی هەیە دونیا بۆ عەشقی مەجازی، بەس**
**(نالی) چییە ئەو بابە: ئادەم کوڕ و حەووا کچ**
(١٦٢:١٤)





تەنانەت هەڵسەنگاندنی شیاو هەیە بۆ ئەو شرۆڤانەی تا ئێستا کراون بۆ ئەم شیعرە. لە جیاکردنەوەی وەزیفەی باوەڕو کاری ڕۆژانەو ئەرکی خۆشەویستیو ...هتد. نموونەی زیندوو لە نێو دیوانەکەیەدا هەیە لە یەکێک لەو نموونانەدا دەڵێت:

**ئەم ئەرضە مزرەعەی عەمەلە و گوڵخەنی ئەمەل**
**هەندێ بووە بە مەسجید و هەندێ بە مەزبەلە**
(٤٦٧:١٤)

یاخود لە توانایی خۆیەوە لە ئایین ئەدوێتو ئەڵێت:

**(نالی) نییەتی سیحری بەیان حیکمەتی شیعرە**
**ئەمما نییەتی قووەتی دڵ، قودرەتی ئینشا**
(٧٨:١٤)

لە بواری خۆشەویستیو عەشقدا نەوەستاوە ئاماژەی بە وەرزەکانیساڵ داوەو ئەڵێت:

**رووم ئەوا زەرد بوو وەکوو پایز لە هیجران (نالیا)**
**عەشق ئێساکەش لە من سەیلی بەهارانی دەوێ**
(٧٠٣:١٤)

نالی لە شرۆڤەی پێناسەکانی ڕۆشنبیریو شارستانیەوە دیدێکی وامان دەداتێ، کە ئەو بوارانە

بەرەو پێداویستیە بایۆلۆژییەکانیش ڕێچکە بگرن. نالی پێ داگریی لە سەر ئەو کردارانە ئەکاتەوە، کە وابەستەو پاڵنەری پیداویستیە دەروونیو ڕۆحییەکانی مرۆڤن؛ مەبەستی ئەو لە زۆربەی زۆری شیعرەکانیدا فاکتەری ڕەمەکو پاتۆلۆژی نییە، بەڵکو لای نالی مرۆڤ شۆڕەندی گونجاندنی شارستانیو ڕۆشنبیرییە بە شێوازێکی مرۆڤانەی ئەوتۆ، کە هاوسەنگی ژیانی کۆمەڵایەتی تێدا بە دەست بهێنێت.

زانست هەوڵی بەردەوامیی مرۆڤە لە دەرەنجامی کۆمەڵێک واتاو بۆچوونو باوەڕو ڕاستیی رای تایبەتو هەڵسەنگاندنی رای گشتییەوە بەرجەستە ئەبێت. بۆ بەلاوەنانی گشت، یاخود بەشێکی زۆری ئەو بەربەستانەی بیری مرۆڤ لە تێگەیشتنی ڕاستی دیاردە مادیو مرۆڤایەتییەکان دوورئەخاتەوە. لە ڕوانگەی ئەو شێوە بیرکردنەوەیەوە نالی لە ڕۆشنبیریو شارستانیی نەتەوەکەیی ڕوانیوە. هەوڵیداوە بیکاتە قەڵغانێک بۆ بەرپەرچدانەوەی هەموو ئەو بابەتانەی ڕەوتی مرۆڤایەتیو گەورەیی مرۆڤ بەرەو لێکترازان دەبەنو کۆمەڵگا سەرگردان دەکەن. لەو توانا بەرفرەوانەیەوە وەک پێویستییەکی سەردەمەکەی ئاماژەی گرنگی بۆ بوونیادنانو بەرجەستەبوونی جەستەی نەتەوایەتی





داڕشتووە. جگە لەو داکۆکیکردنو هەوڵە زۆرەی بۆ سەپاندنی زمانی کوردیو ئاشکراکردنی گەورەیی بەرامبەر زمانەکانیتری ناوچەکە لە چەندین بواری بەراورددا. وەک لەم نموونەیەیدا دەڵێت:

**(نالی) کە ویقاری نییە، بێ باکە لە خەڵقی**
**صۆفی کە سلوکێکی هەیە، عوجب و ریایە**
(٥٦٥:١٤)

یان ئەو ڕەخنە کۆمەڵایەتیانەی ئاڕاستەی بیری خەڵکی کردوونو چەندین دیاردەی دزێوی ئاماژە پێداوە. لە یەکێک لە شیعرەکانیدا دەڵێت:

**ریشەکەی پان و درێژە، بۆ ڕیا خزمەت دەکا**
**ظاهیرە هەر کەس بەطول و عەرضی ڕیشیدا ڕیا**
(١٢٨:١٤)

یاخود دەڵێت:

**شێخم، چ گەرمە حەڵقەیی ذیکرت بە ڕەشبەڵەک!**
**حاڵی ئەمانە خۆ بە جەنابت موحەووەلە!**
(٤٦٧:١٤)

نالی لە پاڵ ئەمانەشدا توانویەتی ترۆپکی خۆشەوسیتی ڕاستەقینەو بە تەنگەوە هاتنو ...هتد لە

کرۆکی مرۆڤدا بناسێنێت. هەر ئەمەشە وایکردووە چەندین کەسایەتیی ئەو سەردەمەو تەنانەت ئێستاش لە واتای بەرفرەوانیو مەبەستی شرۆڤەیی شیعرەکانی بکۆڵنەوەو بەراوردی بکەن.

نالی خۆی گرنگی گەورەیی خۆیی بەچاکی درککردووە ئاماژە بە گرنگی بوونی خۆییو دڵسۆزی خۆی ئەکاتو ئەڵێت:

**مەڵێن کەڵکی نەبوو، ڕۆیی، جەهەننەم!**
**سەرم قەڵغانە بۆ تیری قەضاتان**
(١٤:٣١٨)

ئەو بابەتانەی نالی لە بیرێکی یەکجار چڕەوە بەرجەستە بوونو ئاماژەو بیری جیاوازیان لێدەبێتەوە. تاکو ئەو ساتەی باوەڕی بوونی ئەو یاسا مرۆڤایەتییانە لای خوێنەری دروستدەکات. ئەوانەش ئەو چەمکانەن، کە کاروباری کۆمەڵایەتی بەڕێوەئەبەن. بۆ نموونە لە سیستەمی ژنو - مێردایەتیدا تەنها سێکس بابەت نییە، بەڵکو ئەو سنوورە ئەبەزێنێتو چەندین بۆچوونی وەک خزمایەتی، ئایین، یاسا، مۆراڵ، ئابووری ...هتد کارلێکی زیندوویان تێدا دروستئەکات. لە ئاوەدانیو ئاسوودەییدا یەکیان پێ ئەگریتەوە. لە شاکارێکیدا بەم شێوازە پڕ بەهایە چووەتە نێو ئەو بوارەو دەڵێت:





**جـەنــانی وەک جینان کردم بە ماوا**
**(حـــەبیبە) ی (مـــاڵیاوا) مـاڵی ئاوا!**

**حــــەڵاڵی بێ نیکاحی حـــۆری عینم**
**بە جـــوتێ نـــاظیری شەرع و فەتاوا**

**زەفافەتگاهی پـــەردەی ئـــاڵی چاوم**
**موبارەک حوجلە بێ بۆ بووک و زاوا**

**صیداقی ڕوونماوو، وەصلی شـــاهید**
**لەگەڵ شایی کەران بێ دەنـــگ و داوا**

**ویصاڵی بێ کەم و کەیفی حوضووری**
**لە (نـــالی) گەر دەپرسی، یەعنی ئاوا**
(١٤: ١٢٢- ١٢٤)

ئەم نموونەیە چەندین بۆچوونی ڕۆشنبیریو شارستانی تیایە لە چەندین رووی ئایینی، کولتووری، چەمکو ئارەزووی مرۆڤەوە[٣]. لە دیدی ئەم مەزنەدا ڕۆشنبیری بەرزترین هێزی دروستبوونو گونجاندنەو ئەرکەکان لەوێدا دەرئەکەون. رووی فێربوون، یاسا،

٣) بڕوانە چەپکێک لە گوڵزاری نالی، مەسعود موحەمەد، کۆڕی زانیاری کورد، بەغدا، ١٩٧٦.

رەوشت، هەموو ئەمانەی لە پەروەردەوە بەرجەستەکردووەو توانایی جێبەجێبوونی داونەتێ. بەو بەهاو نەریتەوە داهێنانێکی نوێو چێژێکی وای تێکەڵاوکردووە، کە لەگەڵ چێژو تواناو سروشتی رۆشنبیری، شارستانی، کولتوورەکەیدا هاوسەنگی کردوونەتەوە. ئەمانە لە شیعرەکانی نالیدا راستینو بە ئاشکرا دیارن.

لای نالی هونەری وریایی لە رسکانو سیستەمی کۆمەڵایەتی باوی کۆمەڵگادا متمانە دەکاتە سەر خاڵێکی مرڤانەی گرنگ ئەویش ئاماژەکردنە. توانیویەتی ئەو بیرکردنەوە بێهاوتایانەی، کە لە سنووری زمانەوانیدا خۆی ئەنوێنێو لە توانایی نالی خۆیدابووە کاری نوێیان لێدابهێنێت. هەر بۆیە ئەو پێگە دیارەشی هەیە. وەک لە دێڕێ شیعری پڕ ئاماژەی لێوانلێوی زانیارییدا دەڵێت:

**سۆزشێکی نەفەس و شۆڕشی نائیی نابێ**
**هەریەکە نەوعە غینایێکە، بە مەعنایێکە**
(٤٦٢:١٤)

پەروەردە بە یەکێک لە کۆڵەکە سەرەکیەکانی رۆشنبیری، شارستانی دادەنرێت. جگە لەو یەکە گرنگو کارایانەی پێشتر باسمان لێوەکردن ئەوە رۆشنبیری، شارستانی خاوەنی چوار کۆڵەکەی پتەوە:





**یەکەمیان:** رێکخستنی ئابووری.
**دووەمیان:** شێوازی یاسا. واتە سیستەمی بەهاکان ئەگرێتەوە.
**سێیەمیان:** پێکهاتەی سیاسی.
**چوارەمیان:** شێوازی پەروەردەیە (٢١٢:٢١)

ئەم کۆڵەکانە ئەو کۆڵەکانەن رۆشنبیریو شارستانییان راگیرکردووە. چەندین راڕەوو چەندین بانێژەی لەسەر دروستبووە، کە کۆمەڵگای مرۆڤایەتیان لە سەر وەستاوە. ئیتر ئەو کۆمەڵگایە لە هەر ئاستێکی پێشکەوتندا بێت. وەک ئەو شاکارە مێژووییەی بۆ سوپای ئەو سەردەمەی قەڵەمڕەوی بابانی وتووەو دەڵێت:

**ئەم طاقمە مومتازە کەوا خاصصەیی شاهن**
**ئاشوبی دڵی مەملەکەت و قەلبی سوپاهن**

تائەگاتە کۆتایی شیعرەکەو دەڵێت:

**(نالی) بە خودا حەیفە دەرەنجێنی دڵی خۆت**
**ئەم طاقمە مەخصوصە هەموو صاحیبی جاهن**
(١٤: ٣٤٠–٣٤٥)

لە روانگەی (ئێدوارد ساپیر)ەوە رۆشنبیری، شارستانییەت تەنها خەڵکانی تایبەتمەند ئەگرێتەوەو مێژوونووسان و ئەنترۆپۆلۆژیستەکان و ئارکیۆلۆژیستەکان و ...هتد بەکاریئەهێنن. بە پێکهاتە مادیو نامادیەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگای ئەداتە قەڵەم(٨:٢٣١).

بەم واتایەی ساپیر بێت رۆشنبیری، شارستانی لە هەر ئاستو پلەیەکی پێشکەوتندا بێت ئەوە واتایەکی کۆگیریی لەگەڵ مرۆڤدا بەرجەستەئەکات. دیوێکیتری رۆشنبیری، شارستانی ئاماژەیە بۆ کەسایەتی مرۆڤ خۆی، وەک ورووژێنەریکی داهێنەری بیریو بەکارهێنەری توانایی ئەو بیرکردنەوانە لە بوارە جیاوازەکانی ماریفەتدا.(٩:٨٠) لەم لایەنەوە نالی خۆی بە چاکی هەستی بە ئاستی گەشەی بیرو سەلیقەو توانایی زانستی خۆی کردووە. لە شیعرێکیدا لە دڵسۆزیو بەتەنگەوە هاتنیەوە هاوار بۆ خەڵکی دەکات، کە بێن سەلیقەو ئەزموونیان بداتیو تووشی هەڵە نەبن. دەڵێت:

**خەڵقی کە هەموو کۆدەکن و بەستە زوبانن،**

**با بێن و لە (نالی) ببیەن شیعری سەلیقی**

**(١٤:٦٥٧)**





بەم پێیە رۆشنبیریو شارستانییەت لە گۆڕاندایە ئەو گۆڕانکارییانە وەک خەسڵەتێکی دیارو تایبەتی بە مرۆڤەوە دەلکێن، بەو مەرجەی توانایی بەدەستهێنانو داهێنانو بەرفرەوانی لە زانستی مادی یاخود کۆمەڵایەتیدا هەبێت. بە واتا روونبیر تاکە کەسێکە نەک هەموو ئەندامانی کۆمەڵگا. چەمکی رۆشنبیریو چەمکی شارستانی هەندێک جار لەگەڵ میراتیی لایەنە نامادییەکانی کۆمەڵگادا تێکەڵ دەبێتو داهێنانی نوێی تیادا ئەدۆزرێتەوە. ئەچنە خانەی بەدەستهێنانە مرۆڤایەتیەکانەوە. لەگەڵ بوارەکانیتردا تێهەڵکێش ئەبنو ئاستی بەرەوپێشچوونی تیادا دەرئەکەوێت. بۆ ئەو مەبەستە هەندێک هۆکار هەڵئەبژێرێت، کە ببنە گرنگترینو گەورەترین هۆکاری پەیوەستبوونی هزری بە رۆشنبیری، شارستانیەتەوەو پێوەی ئەلکێنێت(٩:١٢٥). نالی لەم لایەنەوە وابەستەیەکی ماریفی گەورەی داهێناوە. بە ئالوگۆڕکردنێک مەگەر هەر لە توانایی خۆیدا بووبێت ئەو کێبەرکێ هزرییە بەرفرەوانە بکات. بزانە لەم ئایەتەوە: (مثل نوره کمشکاة فیها مصباح) چیمان پێ دەڵێت:

**جامی تاقی مەیکەدە میشکاتی قیندیلی دڵە**

**شیشە پڕ قەرقەف لە رەفرەف شاهی عالی رەفرەفە**

**(١٤:٤٥٤)**

نالی جگە لەو شیعرە چەندین پارچە شیعری نایابی‌تری هەیە لەوانەی، کە بۆ مردنی باوکی حەبیبەی گوتووە لە دیوانکەیدا، ل١٣٧-١٤٤ یان بۆ بێ مەیلی خودی حەبیبە خۆی لە چەند لایەنێکەوە لە رۆشنبیریو شارستانی دواوەو لەدیدی خۆیەوە ئاماژەی ئەو بەراوردەی بە چەند بنەمایەک کردووە[٤].

نالی وەک زۆر بیرمەندی‌تری دنیا لە زۆر لایەنی سایکۆلۆژیو کۆمەڵایەتیەوە لە ئایینی روانیووە، کە بە بیرێکی مرۆڤانەی وابەستەی دڵی مرۆڤو خوای زانیووە. وەک جۆرێک دڵسۆزی هەستو دڵی وابەستەی بوونەوەرێک کردووە، کە زۆر لە خۆی بە هێزو گەورەترە، هەر ئەمەشە بە گشتی وا لە مرۆڤ دەکات، کە بپارێتەوەو پەنا بۆ نوێژو ترادیسی جیاجیا ببات. چیو کامەی بەلاوە بەرزترو گەورەتر بێت ئاماژەو گرنگیو بۆنەی تایبەتیان بۆ رێک بخات. هەموو ئەمانە لە لاوازی مرۆڤەوە بەرجەستەبوون. نالی لەم روانگەیەوە ئەمەندە باوەڕی بە خۆی هەبووە لەو هۆشوگۆشو بیرە بەرفرەوانەیەوە دەستی زانستو زانیاری گرتووەو گۆڕانکاری بونیادنەرانەی لە بری لاوازبوون تیادا دەرخستووە:

٤) (بڕوانە دیوانی نالی، ل ٥٩٢-٥٩٦.)





**ئەشکم، کە لەگەڵ عەشقمە، طیفلێکی فەهیمە**
**هۆشم، کە لەگەڵ خۆشمە، پیرێکی نەزانە**
(٤٧٨:١٤)

ئەمە هەر ئەوەیە، کە فەیلەسوفی یۆنان (ئەبیکۆرۆس) ئاماژەی پێداوە بەرامبەر بە جەنگی بەردەوامی نێوان بیرو حەزو ئارەزوو. ئەتوانرێت لێرەوە هەست بە سەرکەوتنی بیرو بەلاوەنانی سۆز لای نالی بکرێت. خۆئەگەر تەماشایەکی شیعری پاڕانەوەی مەدینە بکەین لە دیوانەکەیدا لە شیعرێکی ٧٤ بەیتیدا ئەو راستییە دەسەلمێنێت، کە وابەستەی بیرەو نالی وەک نالی خۆی دەناسێنێتو دەڵێت:

**موڕادم ذیللەت و پاڕانەوەی حاڵە، نەوەک نەعتە**
**بە چەن بەیتێکی کوردانە، کە قورئانت ثەنا خوانە**
**ئەگەرچی کوردی دەوری شارەزووری قەسوەتم، ئەمما**
**وەسیلەم طەیبەوو حلمی شەفیع و فەضلی مەننانە**
(٥١٧:١٤)

ئەمە بەشێکە لەو گۆڕانکارییە بیرییانەی رۆشنبیری، کە هێزی نوێ بەرەوڕووی نۆژەنبوونەوە دەکاتەوە، تاوەکو هەرچی پشکۆڵە بە دەرگاکانی زانستەوە بکرێنەوە شوێنی زیاتر، بیری گەورەتر، کاری نوێ بێتە کایەوە. نالی خۆی ئەم راستییەی ئاماژە پێداوە، دەڵێت:

